# چل فەرمودەی پێغەمبەر

دیك خراوی

**محمد قزلجی**

بغداد چاپخانەی

نجاح

١٩٣٥ – ١٣٥٤

هەر نسخە امضای مؤلفی پێوە یە بێ

دزیەتی یە

نرخی ٤٠ فلسە

بسم الله الرحمن الرحیم

دیاري

ئه مه چل فه رموده ی پیغه مبه ره ته رجه مه م کردن وشرحیشم، کوردي ر. ژ لی کردن،ئه ي ده مه یه دیاري بمر هاو زوباتانم که بزانن آیینی راست پیاوی ئه خاته سه ر راستي له گوفتار وکردارا وئه یه وي پیاو بکا به به رزورتریني پایه ي مه ر دایه تي . اومید ئه کم به هره ي لی ببري .

محمد قزلجی

١٦ جمادي الثاني ١٣٥٤ ١٥ ایلول ١٩٣٥

ئه مه وه ده رئه خائه م نیشانانه ی بوده رهینه ري فه رمو ده کان دانراوه :

خ — بخاري ، م — مسلم ، ق — اتفاقیان ، ح — احمد بن حنبل، د— ابوداود ، ت— ترمذي ، ه—ابن ماجه، ن— نسائي خد — بخاري في الادب ، تخ — بخاري في التاریخ ، طب — طبراني ، خط — خطیب ، هب — بیهقي ، عد — بن عدی

١) عن عمر بن الخطاب رضي الله تعالى عنه قال: بينما نحنَ جلوس عند رسول الله صلى الله عليه وسلم ذات يوم اذ طلع علينا رجل شديد بياض الثياب شديد سواد الشعر لا يرى عليه اثر السفر حتى جلس الى النبي ص فاسند ركبته الى ركبته ووضع كفيه على فخذيه وقال يا محمد اخبرني عن الاسلام فقال رسول الله : الاسلام ان تشهد ان لا اله الا الله وان محمد رسول الله وتقيم الصلوة وتؤتي الزكوة وتصوم رمضان وتحج البيت ان استطعت اليه سبيلا قال صدقت قال فعجبنا له يسأله ويصدقه قال فأخبرني عن الايمان قال ان تؤمن بالله وملئكته وكتبه ورسله واليوم الاخر وتؤمن بالقدر خيره وشره قال صدقت قال فاخبرني عن الاحسان قال ان تعبد الله كانك تراه فان لم تكن تراه فانه يراك قال صدقت قال فاخبرني عن الساعة قال ما المسؤل عنها باعلم من السائل قال فاخبرني عن اماراتها قال ان تلد الامة ربتها وان ترى الحفاة العراة رعاء يتطاولون في البنيان ثم انطلق فلبث مليا ثم قال يا عمر أتدري السائل قلت الله ورسوله اعلم قال هذا جبريل أتاكم يعلمكم دينكم.

له عمري كوري خطاب گير راوه‌ته‌وه كه‌فه‌رمويه.له ده‌میكي

دا که له خدمت پیغه مبه ر(ص) دانیشتبوین ده رکه وت پیاویکي
زور لباس سپي وه موردش هیچ توزي ریبه ي پیوه نه بوهات •
دانیشت ئه ژنوي به ئه ژنوی پیغه مبه ره وه ناهه ردو ده ستي
له سه ردووړانه ي دانا وه گوتي ئه ي محمد پیم بلي اسلام چي یه
پیغه مبه رص فه رموي اسلام شاهدي دانه به وه ي که هیچ
چشت ئی په رستن نیه مه گه رذاتی خوا (الله) وههم شاهدي
دانه به وه ي محمد خوا ناردویه وه پیغه مبه ره وه نویژ کردن
وه زکاة دان وروژو گرتن وحج کردنه ئه گه ربتواني ـ پیاوه که
گوتي راست ئه که ي عمر گوتی تعجبان کرد که لیي ئه پرسي
وتصدیقي ئه کا. له پاشان گوتی پیم بلی ایمان چي یه : پیغه مبه ر
فه رموي ئه وه یه باوه ری بکه ي به خوداوه ملئکه وکتیبان
پیغه مبه رانی وه روژی زندوبونه وه وباوه ري بکه ي به قدرخیر
، گوتی راست ئه که ي، گوتی پیم بلی احسان چي یه ؟
ژي ئه مه یه خوداي په رستي وه کو ئه مه بیبیني ده ته ماشاي
بکه ي ئه گه ر ئه تو ئه و نه بیني ئه و ئه تو ئه بیني گوتی راست
ئه که ي • گوتی روژی زیندوبونه وه که ی دي ؟ فه رموي :من

له تو چلترئه مه نازانم گوتي نيشاناني ويم پێ بلێ ئه رموی ئه مه يه
كه نيزه خانمي خوێي لێ بيێ وه پێ خواس و روتان شوانان ببيي
خه ريكي خانو دوروست كردن وه حێ بلند كردن ببن .
له پاشارۆيي وه پيغه مبه ر لوكه مي راوه ستاوه فه رموی ئه ي عمر
ئه زاني ئه وه كێ بو ؟ گوتم خواو پيغه مبه ر ئه زانن گوتي ئه مه
جبريل بو هات بۆ فيرو بكارێ وشوێن دينتان

لم حديثه وه ده رئه كه وي جوی يه تي ايمان واسلام وه ئه مه
ايمان راجعه به دل وده رون واسلام ايشي زمان وته نه چو نكه
ئه مه گوتي هه ردو شهادت وه نوێژ كردن وه روژ وگرتن
وه زكات دان وه حج كردنه بۆكه سي كه بتواني .
ايمان ، دل گرتن وباوه ري يه به خوداوه به ری ( ملائكه )
وكتيبان و پيغه مبه ران وه روژی زندو بونه وه ، وبروا كردنه بو ئه مه
چا كه وه خه راپه وه خير وشر به قدری خودايه

خـــــودا

خودا ئه م ذاته يه كه له روی زانيني زورو داگير وه توانيني

بي پايان ئەم عالمەی بە هەموو رەنگو ریشەوە لك وپوپ دوورست کردووەو ریکی خستووە وە هەموی لە ژیر فەرمانی وی دایە هەرچون آرەزو بکا هەلي ئەسوريني .

بون وپيك هاتي ئەم عالمە بەم رەنگي شيرين وە ريك وپكي وەنظام جوان وبي وينە وە بەم هەمو سود ومنافعي بي ئەژمارە،دليلي آشكرايە لەسەر بون ووجودي خوداوەتووانيني گەورەی وی کە بەرەژيري هەموو وانينانە .

يەکەتي ترتيب وە يەك کەوتي هەمولاوە اجزای عالم وە پەي وەست بونيادبکە وە گەورە ترين برهاني يەکەتي خودايە .

انسان لە دوورو ست بون وە پەيدابوني خوي بەم جواني رەنگ وبالاوە بەم هەمو اعضای تەنی کە هەمو هو شيارانە سەردان وە داماون لە تی گەيشتني خواصيان ، وە بەم هەموسەرچاوانەی تی گە يشتن وە زانين وە توانين بزوتنە،پەي ئەبا بە خوداوە ئەزانی کە توواناي کي زورگەورە وە بلند ئەمي هينا وەتەسەرزە وي وە بونی پی بەخشي وە .

ایمان وباوه ری به خوداي ریك خه ری ئەم جهانه ( عالمه ) وه سورپی ده ریٚ ئەم چه رخه ، سر شتي انسانه دلي له سه ری دور ست کراوه هه میشه بوي لی ئه دا ایتر بی ناوي دلیل وبرهان . هه موکه سرله تنکاني وگیراوي یاله خوشي وشاتی خوی دل‌لی دانی خوی بولای گــــه وره بی خواتی ئه گا ؛ به ستراوي دلی خوی بو ئەم باره گایه ئەزانی.

پەری (ملئکه) ملائکة

پەری عالمیکی وونه ، خواي گه وره بی که یاندوین بو نیان که ئەمانه ش له مخلوقاتي وین هه رچی فه رمانیـان پی بکائه ی کەن وه هیندیکیان له ناوی خداو پیغەمبەران دین وئه چن.

پێغەمبر

پیغەمبر ، انسانیکه خوانا ردویه بو پي نیشانداني خاق ریگەی اشی له دنیا وآخرت پیغه مبه ران ، له ناو کوٚمــه لەی بشر ، له کومامو سنتای آموژ کار وان ، ریکه ی چاکي وخوابه رســتي

وە دل رونی وپاكدە رونی فیری مخلوق ئەكەن قانونی دل چەسپ كە بە عدل وداد، بشری پی ئژی دائەنین . هیندیك لە پغەمبەران كلامی خواوە كتابی آسمانی یان بو ها توە وكە ورە ترینی واللە قرآنە بە زبانی عربی كە ئەوی سببی گەورە یی وبلندی وسعادتی بشرە تیدایە بە عباراتی جوان آو داروە شیرین .

## روژی زندوبونەوە

روژی زندوبونەوە روژیكە كە خواپاش تیك چونی ئەم عالمە وە ویران بونی نظام دنیا، هەمو انسانان زندو ئەكاتەوە لە سەر ایشی دنیا حسابیان لی ئەكیشی ، پیاوی باش ئەنیری بو بەهەشت پیاوی خەراپ ناپاك ئەنیری بۆدۆزەخ.

## قـــدر

معنای قدر پێك هینانو دورست كردنی عالمەلە سەر روی زانینی كون ونقشەی پیشو. هەروە كو معماری دانا چلون لە پیشەوە ، ئەندازە ودوینەی قصر ئەكیشی ولە پاشان بەم جورە

دور ستي ئه كا خواش، له روي زانين وتر تبيّ له پشه وه داي ناوه ئه‌م عالمه وه‌ده‌ر ئه‌خا وئه‌ي هي نى ته وجود . رب العالمين

## احسان

له پرسپار كردني احسان وه‌ده‌ر ئه كه وي ، كه احسانيش وه‌كو ايماز واسلام منظوره نابى له ده ست بچي به‌راستي احسان گيان عبادته ، هه ركه س له عبادتي خوي داخوي وابيني كه له به رده ستي خواراوه ستاوه وخوا آ گاي له دل ودروني وي هه يه ، به‌چا كي عبادت ئه كا وهه‌رچي پي ئه‌وي به جي ديني عبادتي كه احساني تيدانه بي هيچ وپوچه له باش بوني نفس وده وده‌روژوري انسان سوديكي لى وه رنا گيري .

## نيشاناني روژي زندوبونه‌وه

مقصود له‌مه‌ي بركه‌فه‌رموي كه نيزخانمي خوي به ولدبيني ئه‌مه يه كه وره بي وبچو كي هه‌ل ئه گيري وخويشي له ناودا ناميني به جوري كچ ، دايك خوي به خذمتكار رائه گري ، ومقصود له

خانو دورست کردنی شوانان ئه مه یه ده ست له چول نشینی هه ل ئه گیری وهه موکه س آرزوی خانو دانیشتن ئه کا .

## به هره ی ایمان

ایمان رباوه ری به خوا وه وانه ی ئه وپی گوتوین سه رچاوه ی هه موگه وره یی وبلندی وسعادته بوانسانی ، ئه بیته کیشنده ی هه موخوی باش وبلا وکردنی عدل وداد وراست گوتن ولادان له خه راپه . ایمـــان به خواچرای ناوده رونه وه رونی دله انسان به وی ریی راست وخوار له ژینی خویدائه بینی نفس ودلی پاك ئه بی خوشه ویستی دنیا زوری لی ناکاره دوای هوی ناکه وی خـــه ریك ئه بی ئه وه ی بلندی یه بی کیشی ئه وه ی پستی یه خوی لی لادا .

ایمان به خوا ، حقیقتی ژین وپیاوه تی له پیاوه که یانی وخوشه ویستی وراستی وبی باکی وآزایی له ناودل دا ئه رویننی .

پیا ومؤمن له هیچ چشت نا ترسی چونکه ی نای هه یه وه دلی

آرام بووه بەبە سترانە وەی بـە بارە گای خواوئەزانی مردن دەرچونە لەجیکە یەك بۆجیێ گە یەکي خوشتر .

پیا ومۆمن ، بە راستي پیاوی خوایە ئە توانی لەجیي خوای دانیشی خلیفـــــە بي لە سە رزەوی بانـگ بکا بوکە ورەيي وئە وانەي عزتی نفسیان تیدایە .

ئە وکەس ایماني نە بی پباوني یە ، گوفتـار وکرداري جیي باوە ري نییە ، خوشە ویستي بوکەس نییە لە خەرابە وضرردان دریغی نا کامەگە رلە عقوبتي حکومت بترسی .

پیاوێ ایمان ترسە نوکە ، لە هە رچی بیتە بە ردە مي لەانسان وزندەور ودا روبە ردئە ترسی . وە چونکە سعـادت وخوشی هەرلە دنیا دائە بینی لە مردن زورئە ترسی وەلەدوا کە وتنی شهوت خونا گیري تەوە لەگە ورە یی نفس روئە چە رخیني .

ایمـان وباوە ری بە روژي زندوبون وە ، سرشتي انسانە وەلە سەری دورست کراوە بویە هە موبشر لەگە ل ئەمە کە جوین لە آووخاك وجی یە كدلن واجماعیان هە یە لە سەر ئە مە کە روژیکي ترهە یە پاش ئەم دنیایە .

ایمان وباوەري بە خوا وروژي زندوبونە وە انسانی لە سەر شوین انسانی راثەگرن واداري ثەکەن بە مەي بە هرە بەريلە کمالی خوي. پیاوبي ایمان بە هرە نابيني لە مزاياي انساني وەکوجانەوە راني ترچە ندروژي لەم دنیایە داثەميي وثە روا بەلکي بە د بەخت ترەلەبە زحمت وزوري بترکە ثەي بيني.

ایمان بە خواوە روژي دوواي جگە لەمەي کە بەجي هينانی حق يە ندەگي تيدايە،بوراوە ستاني کومە لەي بشريوە راگرتني خوشە ويستي وتيکە لی و پایە دار کردني عدل ودادلە ناوعالمدا زوري ويستە ، کە هيچ کومە لەبەبي خوي ایمان ناميني وايستوارنابی .

(٧) عن ابي رقيه تميم بن اوس الداري ان النبي صلى الله عليه وسلم قال (الدين النصيحة قلنا لمن قال لله عزوجل ولكتابه ولرسوله ولأئمة المسلمين وعامتهم م

له ابو رقيه تميم كوري اوس داري گير راوه‌ته‌وه كه پيغه‌مبه‌ر (ص) فه‌رمويه : دين پاك بونه . گوتمان له گه لكێ نه‌رموي : له گه ل خوا وكتيب و پيغه‌مبه‌ري، وامام پادشاي مسلمانان وله گه‌ل هه‌موكه سى تر .(١)

---

(١) آشكرايه ايمان وباوه‌ري به‌خواوه‌ئه‌مه كه ئه‌و آگاداره به هه‌موچشتي انسان وه له سه‌رهه‌مويشان تولّه‌ي ئه‌داته‌وه، سه‌رئه‌كيشي به پاك بون وخالص بون له گه‌ل هه‌رچي له ده‌ره‌وه‌ي انسانه وه پي يه‌وه په‌يوه‌ستي هه‌يه . وه‌له ناودلا ئى گه‌يێشتني پرسيار لى كراوى (مسئوليت) په‌يدائه‌كا .

له پاكي وتى گه‌يێشتني پرسيار لى كراوى ، له سه‌ر انسان واجباتيك په‌يدائه‌بى كه ئه‌بى هه‌ميشه له پيش چاوى بى وه به‌جي‌يان بێني ئه‌م واجباتانه هينديكيان راجعن به خوا

٣) عن معقل بن يسار ان رسول الله (ص) قال : ايما وال ولى شيئاً من امر امتي فلم ينصح لهم ويجتهد لهم كنصيحته وجهده لنفسه كبه الله تعالى على وجهه يوم القيامة في النار . طب
هه ر كه‌س ايشى كي پى ئه سپێرا وابى له‌ئيشان اُمت من (١)

وهنيديكيان راجعن به كومه له ، واجب خوايى ، ايمان وباوه‌رى يه به خووا گه وره‌يي وى وه‌شه‌رم وحيالى كردنيه وه‌باوه رى به پيغه‌مبه‌رانيه وه شوين كه‌وتنيانه له هه مواپشان وه كتيب خويندنه وه‌ى خوايه وخوباش كردن وگيان چاك كردنه‌له‌م رووه كه ئه وفه‌رموبه .

واجب كومه له بى ، كوشش كردنه بو پيك هينانى ئه مي گه‌وره‌يي اُمتى پى په‌يدا ئه بى ، له‌ريك خستني دلان وه بلاو كردني زانين وعدل وداد وه مه‌ردوم آشنا كردن به حقوق وه‌ده ستي داماوان گرتن وه‌كومه‌گ كردن‌به پادشاله ريگه‌ى راستا وه‌وادار كردني مه ردومه به بي باكى وه آزايي وراست گويى وخورا گرتن له ته نگانانه‌دا .

(١)هه ركومه له يه‌ك‌پا كي وراستي له‌ناو پياوانيان‌دا‌پايه دار

وه پاكيان لەگەل نەكاركو'ششيان بونەكا ودكو پاكي وكوشش لە ايشي خوىدا ، خوائه وى بـه سـەر رودائـه خاته آگري دوزەخه وه .

٤ عن ابي موسي قال رسول الله (ص) المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضاً . ق

مؤمنان وەكو بناوان يەكتر توندئه كەن .(١)

---

وايستوار بو بەجوري كە هەركاميك ايشيكي حكومتي پي بسپيردي وەفەرمانيكي گەورە يا بچوك پيي واگوزار بكري ، زور بـه راستي وه دور ستي وەكو ايشي خوي ، پيكي بيني وجيي بە جيي بكا ، ئەم كومە لە يە هەميشە لەبلندي وه گەورەيي دائه بن كەس ناتواني زوريان لى بكا وه ئەكە رناپاكي وفريب وخيانت لەناويان دار بو چكە لە عذابي روژي زندوبونەوه دوچاري نەمان وه ژيردەستي قوميكي ترئه بن .

(١) انسان لە ناوئەم عالمەداجوي بوتە وه بە مه كە ناتواني بە تەنها بژي وه بي وي ستە بە تيكەلى لەگەل دەستەيە لە هاوالاني

⑤ عن انس بن مالك قال : رسول الله ص لا يؤمن احدكم حتي يحب لاخيه مايحب لنفسه. ق/هيچ كه سێ كتان ايمان كارنابی تاواي لی دێ كه ئه‌مي بۆخۆی پێ خوشه بێ بيه‌بۆبراي مسلمانيشي پێ خوش بێ (١)

---

خوی تابه هه‌ مولاپي پي وي ستي هه مولاپێك بين وه‌هه‌مو له كاری يه‌كتر به هره به رن وئه بی هه‌ريه‌ك له ناو كومه له‌ی خويا ايشي وكاري بكبی كه سودوبه هره‌ی بوواني تربي ئه نائه ئه بيته داري بێ خێرئه‌بي بيرري ، بويه پێغه‌مبه‌ر تشبيه مؤمنان فه‌رمووه به ديواري خانو ، يه‌ني هه‌ر يه كه ئه بي پي ويست بيێ وه ساختمان كومه له توندبكا وه دياره كومه له‌ی وا ئه بي عدل وداد وبرايه‌تي له برابه ري قانون وآزادی تيدابي كومه‌له‌يه زوري وخوبه زور گرتن وبي انصافي تيدابي وه‌كو خانوی شكست وايه زوئه روخي .

⑥ (١) انسان، شار ستانيه به ته نها ناتوواني گوزه ران بكائه يه‌وی كومه لكوتی كه‌لی هاوالانێ كه به هه‌مويان مايه ي ژيانی

(١) عن ابي هريرة ان رسول الله صلى الله عليه وسلم قال : المسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده والمؤمن من امنه الناس على دمائهم واموالهم . ح ت ن

مسلمان كسيكه مسلمانان لەزوبان ودەستي دەرچن وە مؤمن كسيكه هەردوم ئەوى بە امين بزانن لەسەرخوين وماليان (١) .

---

خويان سازبكەن . وە اشكرايه ويك كه وتن وتيكه لى انسانان ئەگەر بەستە كي زوّر توندبان لە ناوانەبي ئە بيتە مايەي فساد وەبەگژيكاچون هەركەس دەست ئەباوّ بچريى حقي يەكي ترەوه زورلى كردني لە مال وآبرووا زوردار بي زور ئە خوا . وەلى ئەگەر بەستەگي بوبەخوشه ويستي وبرادەري آسايش لە ناويانا پايەدار ئەبي وەكو براياني ناوماليكي ئەژين هە مولا بوخوش كردني جي ووطن ئەكوشن ، ديني اسلام لە بەر ئەمە اُمّتي خوّي دعوت فەرمويە بەخوشە ويستي يەك تر تاكومەلەي اسلام تيك نەچي وە اجزاي لە بەريەك نە بچرين .

(٢) (١) ايمان وباوەري لە ناو دلاني كه يبشتن بەلى پرسي نەوەي پەيدائەكانا هيلي پياوبو لاي خەرابە وەدە رردداني خلقي بچي وە

(٧) عن عبدالله بن عمرو ابن العاص ان رسول الله ص قال : اربع من كن فيه كان منافقا خالصا ومن كانت فيه خصلة منهن كانت فيه خصلة من النفاق حتى يدعها اذا حدث كذب واذا وعد اخلف واذا عاهد غدر واذا خاصم فجر . ق

چووارخوهەن له هەرکەسابن ئه ومنافقي خالصه وه هەرکەس يه کيك له واني تيابي خوبه كي دوروئي ( نفاق ) تيائه بي تالاي ئه دله خوى : ئه گه رگوته بکەريته وه درۆ بکاوه ئه گه روعده بدا به جي نه هيني وئه گه رپه يمان بدا به سه ري نه باوه ئه گه ردو شمنايه تي بکا نازالي . (١)

---

هه مو کەس دور ونزيك زه نکين وفقير له زوبان وده ستي دەرئه چي وبه راستي وپاكي له گەل به نده كاني خوائه بزويته وه وه سر وماليان ده ستي زوري وي نا کاتي جوين نادا پاش پله گ... ... قصة ناهيني وه نابا زور نا کا فيل وفريبي گه رايان ئه وتي گه يشتنه له ناودل ناوي بي راستي نييه .

(٧٢) ئه بي پي وابي پاسه وان لەسه ردل وزوباني

(٨) عن ابي هريرة ان رسول الله ص قال . لاتحاسدوا ولاتناجشوا ولا تباغضوا ولاتدابروا ولا يبع بعضكم على بعض وكونوا عباد الله اخوانا . المسلم اخو المسلم لايظلمه ولا يخذله ولا يكذبه ولايحقره التقوى ههنا (ويشير بيديه الى صدره ثلاث مرات) بحسب امرء من الشر ان يحقر اخاه المسلم . كل المسلم على المسلم حرام دمه وماله وعرضه . مسلم (*) رواه

آوات پێك مه خو وازن وفيلى ليك مه كه ن وكينه مه كيشن وه پشت تيك مه كه ن وبه سه ر يه ك ترامه فروشن ئه ي به نده كاني خوا ببنه برا . مسلمان براى مسلمانه زوري لي نا كا و په ستي ناكاوه دروّي له گه ل ناكا وبه سوكي نا گري .

---

هه يه ئه بي خو بگيريته وه له دروّي شرطي وئي په يماني كه ئه مانه مايه ي سوكي و پايه ي په ستي انسان وپياوي جوانميرله دوشمنا يه تيشا خو راگري جوين نادا وگوته هه ل نابه ستي (بهتان ناكا) وه هيچ له ئه ندازه ده رناچي .

٨ (*)ديي اسلام، ئه يه وئي له ناو په روانى خوى پايه ي يه كه تي دامه زريني وله ناويانا زور تونده سنه كي بي ، وه به گژ

پاریزلە خوا دیرە دایە (دە ستي بوسینەي راداشت) بە سە
بو پیاولە خە راپە ئەمە رای مسلمانی خوی سوك بکا هەموچشتي
مسلمان لە سەر مسلمان حرامە خوین ومال وآبروي .

٦ عن بن عمران رسول الله ص قال: افضل المؤمنين احسنهم خلقا. الحاكم
گە ورە تريي ايمان داراز، خوش خوتريي وانە. (*)

---

يەكانە چن وخوين وآبروي يەك نەريژن وە ئەمەي مايەي نيوان
ناخوشي وتيك چونە نە كەويتە ناويان تا كومە ليان لە بە ريەك
نە ترازي زور بە گەورەي بمينن . كە زانراوە هەرقوڕي كيشە
بولە ناويانا وە لە يەك دل پيس بون ، نامينن وە لە سەر روي
زەوي هەل ئەگيرين .

ئەمە كە فەرموي پاريزليرە دايە، تي ئەگەياندكما كي وراستي
ولە خواترسان بە دل ودە رونە ، ايتر بە نويژو روژوي روتي بي
گيان وروح نيية ، پياو ئەبي دلي خاوين بي وروناك بە جوري
بە چراي دلە وە بە ريدار وا خولە ايش وكاري بە زيان لادا

٦ (*) خوي باش سەنگيني وە گرانيية لە آرە زوانا وە آراي
وجوا نميري ئەوە زانيني بە ري چونە لەم دنيايە دا .

(١) عن شداد بن اوس قال رسول الله ص الكيس من دان نفسه وعمل لما بعد الموت والعاجز من اتبع نفسه هواها وتمنى على الله الاماني ح

بەهوش کەسیکە نفسی خوێی بەرودرش بد لە مردن بترسي ،
داما وکەسیکەیە شوین خواستەي نفس بکە ويوە آرە زووان لە
خوا بخوازي (*)

---

خوی باش را کرتی هەمو هێزانه (قوی) لە ئەندازەي
کمال وبەري راستاچونە کە پیا وزور خور وە ژن بازو توندو تیژ
وە بی هوش وتیژ رونە بی، خو بە زورنە کري لە کیەل مەردوم
گرژ رو وبي مبالات نە بي چاك هەستي، ە دانیشی وترسەنوك
وبي دل ودورو وراست شیرە وە نە بي: لە هە موچشتان
ئەندازە راکري وباش بزویتە وەوباش بزاني ژي کە سی
ئەمانەي نەبي یاجانە وە دیکي خویري یادروندە یەکي مارە

(*) پیاوی بەهوش وزانا ئەمەیە هەمو هێزاني (قواي) خوّي
لە ئەندازە راگري ، پێش بونفس بەرە لانەکا وە شـــوین
آرە زووان نکەوي گیان وروح پەروە ردە بکا لەسەر روي
نیکە یشتن وە نفسي خوي باش بکا کە سەر کیشي نەکا لە اندازە
ولە روي پیاوەتي خواستەي خوي پیك بینی .

(١) عن وابصة بن معبد قال اتيت رسول الله (ص) فقال جئت تسأل عن البر ؟ قلت نعم قال استفت قلبك البر ما طمأنت عليه النفس و طمأن اليه القلب والاثم ما حاك في النفس وتردد في الصدر وان افتاك الناس وافتوك . ح

له وابصه كوري معبدي گيرراوه ته وه كه گوتويه هاتمه خزمت پيغه‌مبه‌ري فه‌رموي هاتوي له چاكه‌ي ئه‌پرسي ؟ گوتم بـه‌لى فه‌رموي له دلى خوت پرسه . چاكه ئه‌مه‌يه دلت پي آرام بڕبه وه گوناه ئه‌مه‌يه له‌دلا ئه‌بزوێ وه‌دێ وئه‌چێ هه‌رچه نـــد [illegible] بوت‌ره وابدرن . (*)

---

كه‌سـي كه‌خوان خوي چاك نـه‌كا و نفسي په‌رورده نه‌بي هه‌ميشه داماوله چه‌نگ نفس ده رناچي به‌كـه‌ يـيشتن به‌ هه‌ر آره زو آره زوي تري بوپه‌يدا ئه‌بي وله به‌دبه‌ختيدا ئه‌ميني.

(*) خوا كه انساني دوروست كردووه پرله آزوآره زو وه هێز وهۆش پێ داو كه‌ئه‌مي دلى بكه‌ويته سه‌ري خه‌ريكي كردني بێ خواه چاك يا خه‌راپ ، دلێكيشى ( وجدان ) داوه‌تي كه‌ئه‌تواني به‌وى چاكه جوي بـكاته وه و بيكا وه‌خه‌راپه‌ش بزاني خوێ

١٦) عن ابي هريرة ان رسول الله (ص) قال لا يدخل الجنة من لايأمن جاره بوائقه . م رواه مسلم

ناچيته به هه‌شتي كه‌سێ كه هاوسايه‌ى آسوده نه بێ له آزاروي . (*)

---

لێ دورخا چونكه دل ، له ایش چاك وباش آرام ئه‌بي وگوشاد وله ايشى خه‌راپ ته‌نگ ئه‌بێ وه‌وێك دێ هۆش مه‌ندان گوتويانه پيش هه‌موتوله‌يێك له سه‌ر ايشان ، انسان بوخوى له ناودلى خويا توله‌ي ايشى خوى ئه‌بينى كه له سه‌ر فرماني باش گوشاد ئه‌بي وله سه‌ر كاري خه‌راپ ته‌نگ ئه‌بي وه برينداره . وه‌لى دل په‌روه‌رشى ئه‌وي چونكي ه‌تي كه لى ناپياوان ليل ئه‌بى وپاس، خه‌راپه‌ى لى ئه‌بيته چا كه وه‌كوئه‌مانه‌ى دزي وري گري ئه‌كه‌ن وخوشيان زور به آزا وگه‌وره ومه‌ردئه‌زانن .

١٧ (*)هاوسايه حه‌قي زۆره وه‌كويه‌كيك وايه‌له پياوان خانه واده ئه‌بى آسوده بى له زاروزوبان وده‌ست وزوري انسان نابي پياو بكۆلێ ته‌وه‌له ايش وكاري وه دووا بكه‌وێ چلون هه‌لده‌ستي وه‌دائه‌نيشى چه ئه‌خوا چه ئه‌كا .

(١) عن ابي سعيد الخدري ان رسول الله (ص) قال : من رأى منكم منكراً فليغيره بيده فان لم يستطع فبلسانه فان لم يستطع فبقلبه وذلك اضعف الايمان . ح — احمد حنبل

هەرکەس لە ئێوە ئیشی ناشیرین وناهەموار ببینێ ئەبێ بە دەستی زۆری گۆڕی ئەگەرنەی توانی بە زوبان ئەگەرنەی توانی بە دل، ئەمەش سستری ایمانە .(١)

---

(١) منکر، ایشی ناشیرین وناهەموارە کە زیانکە بەنی بە نفس بابێ کە پیشتن یادین یا آبرو ویا مال خواه ای یەك کەس یا ای کومەلە وەئەگەرایشی وا کە ورە یاچوك لە هەرکەس وەدەرکەوی ، کە لانەچی ، فاش ئەبی وبەلا وئەبە بیتەوە هەموکەس پێی گرفتار ئەبی پەس پیاو ئەبی بەرابەری ایشی وا ئەکا نە هەلی پەرە بگری . ئەگەر بە زور نەی توانی ، بە تی کە یاندنی مردوم وآشکرا کردنی زیانی لە لابردنی کوشش بکا ئەنا بەدل پێی ناخوشبی وەدوستی لە گەل کەسی ئەوی کانەکا وخوی لی دور خاتەوە .

لە منکر وناهەموارە باوەری بەهەشتی هیچ وپوچ لەدار

(٤) عن علي ان رسـول الله (ص) قال : المجالس بالامانة . (خط)

خـەربونەوە لەجێی کۆبوونەوە ئەبی لەگەل راستی ودوورستی بێ . (*)

---

وبەردوئەمانەی ناتووانن سود وقازانجی بکەیەن، وحکایات درو،نە زانین وبێ ایشی وصنعتی وتەنبەلی‌ودووا کە وتنی چشتانی کەهیچ بەهرەیان لی پەیدانابی وئەمە کەسی لە شوینی خوی دەرچی یا فریبی مەردوم بدا یا چشتی وا کە میشکی ووشك ئەکا بلا وبکاتەوە ، ئەمانە هەموئەبی لابرین ئەمە کە فەرموی سس تری ایمانە اشارەیە بەمە کەایماندار ئەبی حق نە شیریتەوە وە ترسە نوك نەبی .

٤ ا (*)چەند کەسیك کەبێ کەوەدانیشتن لە جێ گەیێ وەهەرچی لەناویانا رابرد، ئەبێ وددەری نەخەن راستی لیك نەلین،هەرچی لە یەك بێ بینن وبێ بیەن ئەبی گومی بکەن ، کە بلا وکردنی ئەم جورە چشتانە نیشانەی ناپیاوی ونامـەردی وسوکی وبەد نیهادی یە .

١) عن عائشة قالت قال رسول الله (ص) انزلوا الناس منازلهم . م
هه موكه س لەشوینی خویا دابنێن . (١)

١٦) عن علي ان رسول الله ص قال خيركم خيركم لاهله وانا خيركم
لاهلي ما اكرم النساء الا كريم ولا اهانهن الا لئيم . بن عساكر
باش تريني ايوه باش تريني ایوه یه بۆژني خوي وه من له هه‌موتان
باش ترم بوژني خۆم که وره یي ژنان رانا گري لامه گەر پیاوي
که وره وه‌سوکیان ناکامه گەر پیاوي سوك (٢)

---

(١) گوره یی وبلندي هه‌رکومه له بەمه‌یه که هه موا یشیان
ریك وپیك بي وله شوینی راست دابسوري ئه مه ش نابی
مه گه رکه هه‌ره رایش وکار به پیاوي خوی بسپیرري وه هه‌ر
که س به ئەندازه ي هه‌ل گرتنی خوي فه‌رماني پي وا گوزار
بکري تا نظام له‌ناوایه یدابی ئه گه ر هه‌رکه‌س له جي گه ي
خوي دانه ندري ، نه زانین وکینه ودوژمنه‌ني ئه که ویته ناریان
وه له‌به ریه‌ك ئه ترازین ونامینن .

(٢) ژن، هاوالی پیاوه سه رمایه ي‌خوشی وه یاري ژینه ئه‌بي
به شیرینی وگه وره یي پیاوله گه لی بیزویته‌وه نابي سوك بکری

(١٧) عن اياس بن عبدالله ان رسول الله (ص) قال لا تضربوا إماء الله (ح) - احمد بن حنبل

لی مه ده ن له که نیزاني خواي .⁽¹⁾

(١٨) عن عائشة ان رسول الله ص قال انما النساء شقائق الرجال . ح

ژنان نیرمه گه رخوشکي دایکي وباوكي پیاوان⁽*⁾

---

وبه خواري ئه‌ما شابكري . پايه ي خوشي ناومال چا كه يه له گه‌ل ژن وخوشه ویستن وباش را گرتنیه تی وه كو پیغه‌مبه‌ر (ص) له كه ل ژناني خوی ئه‌ي كرد .

(١) انسان ئه‌خريته سه‌رريی راست وایشي باش كردن وتی گه‌یشتني فه‌رمانان به فیر كردن وبه روه رش دانه نه ك به لیدان، ژنیش انسانه نابي لی بدري وه بخريته به ركوته ك ئه‌بی آشنا بكري به مه‌ي پي ويسته له ژينا وزور به چاوي شيرين نكا بديري .

(*) ژن وپیاوهه ردو وه‌كويه كن له‌به ژن وبالاوهيز وتي گه‌يشتن ودل وآره زووان جو يبه تي يان نييه بويه خواش له فه‌رمانانی خو ياوه كويه كي داناوون شتيك هه يه ژن اي زوره وه‌يه پياوهي ده ره وه . هه روه ك پياوئه يه وي بو به هره بردن له هيزاني

عن علی ان رسول الله (ص) قال تزوجوا ولا تطلقوا فان الطلاق
یهتز منه العرش . عد

ژن بینن وه به ره لایان مه‌کن که‌جوی‌بونه وه‌ي ژن وپیاو
عرشي لی ئه له رزي (*)

---

خوی په روورده بکري ري گه ي گه وره بی نیشان بدري پی
بخوینندري، ژنیش ئه بی بەم جوره آشنا بکري به وه‌ی پی‌ویسته
بوژیان پی بخوینندري دلی زندو بکري ، تاخو بري وپه ست نه
بي، وه به چاوي سوك ته ماشا نکری. بلندی هه‌رکومه له وه
ده سـته له انساناني به بلندي ژنیانه که‌ژن خوي باش و تی
که بیشتي بو منداليشي وا گه وره ئه کا وه سر رشته‌ي گه‌وره
بون وبلندي یان ئه‌داتي. ئه لین باوه شی دایك بیشکي کومه له‌یه

(*) خوا واي داناوه که پیا وژن به‌سته گیار هه‌یه به‌یه‌کتر، بەم
به‌سته گیه پایه‌ي خانه واده گي دائه مه زري وه هه ردوخوشي
لیك ئه بینن . په‌س پیاوئه بی ژنـ ببی وه نابي په یمانی خوي
زو بپچري ئه بی هه ردو لاده ردي یه کتر هه‌ل گرن بوپه یدا

(٤) عن انس ان رسول الله (ص) قال : اكرموا أولادكم واحسنوا آدابهم ه

منالان تان خوشه ویست را گرن وخویان چا بکەن .(١)

کردی خوشی خۆیان بکوشن . ژن وه لاغ نیه پیا وهه ردەم آره زوی هینا هەوساری دامالی وەبەره لای بکا سویندخواردن به طلاق نیشانەی سوکی وناپیا وییه . وبوپایه دار بونی پەیمانی ژن ومیردا یەتی ، له پیشەره هـه رد ولا ئەبی خوی یەك تر بزانن وچاك لیك بکەن تا گری ژن ومیردایتیان هەل نه وەشی .

(١) باوك ئەبی منـالی خوی کور یا کچ رپه روه رده بکا وکار وکرداری باش وهەرچی پی وی سته له ژیانا فیریان بکا هیزانی ( قوی ) تەن وگیانیـان به رز وتوند بـکا بەبازی وباری وخویندن وخوی چاك آشنا کردن تاپه ره بگرن لەـەر پیارەتی وجوانمـه ردی . منال ئەبی خوشـەویستی دین وتاریخ پیغەمبەر واصحاب وپەیره وانیان وەگەوران یادبدری تادورکه وتن له آرەزووانی پەـست وەدل لی دان بوگه وره بی له پیشەره بایته خوی. منال ئه بی دلی زندو بکری کەخوی بە پرسیارلی کراوبزانی

١> عن عمرو بن سعيد بن العاص ان رسول الله ( ص ) قال : ما نحل والد ولده افضل من ادب حسن . ت

نەي داوە چە باوكان بەمنالي خۆيان باش تر لە ادبي شيرين.(١)

---

لەسەرهەموايشان وگەورە كردني وطن وكوشش كردن لەرێی بلندي ويدابكريتەسرشتی ئەبي جاوي بكريتەوە كە دنيازورچاك تي بگا وە پێ ويستي خوی وە ئەوي لەسەريەتي لە برابەر نفس وخزم وكومە لە ووطن وخوا . بيزاني تووي آرايي ، سەنكيي راست رەوي وخورا گرتن لە تەنگاناندا بچين رێ لە دايـدا تا گەورە ببيە وەپياويكي راستي بي .

خوشە ويستيي منالي ئەمەيە وا گەورە بكري نەاينكي بەرەلا بكري وپارەی بدريتي وەيا بوي بجي بيلدري .

(١) پياوەتي انسان بلندی وی لە سەرجانە وەری تربە ادب وخوی پەسەند وەرا گرتي هەموهيزانە لە شويني كمالا كەسەر وخوار نەكەن . ئەمەش پيك نايامە گەرەبە يادداني وفير كردني لەمنالي كە لە پيشەوەپايەی رێ كردن بو گەورەيي ودخوش بەختـــي وجوانميری راستي لە دليا دابرژي ولە سەری گەورە ببيە، پەس

عن ابى رافع ان رسول الله ص قال : حـق الولد على الوالد ان يعلمه الكـتابة والسباحة والرماية وان لا يرزقه الا طيبا. هب

باوك له سه ريه تى بۆمنالى خۆى ئه مه فيرى نوسين ومه له وتير آويشتني بكا وه هه ربا كي (حلال)ى ده رخوارد بدا[1]

---

باوك ئه بي هه ميشه له به رچاوي بي كه منالي گه وره بيه له سه ر شيرين ترخوان ئه نامنال خوري ده رئه چي وه كوجانه وه ري ترچه ندروژى به ماندوبون لهم دنيايه دائه مينى وه ئه روا .

(١) به رِته رى وخۆش به ختي به زانين وهيزي لادا ني شا لاوانه له سه ر وطي و به په يدا كردنى مالى پاك وخوبارا ستنى له خواردن وبردنى چشتي مه ردومه

ئه بي باوك له بچوكي منالى خوى بخاته سه رري مه ردايه تى وه رى وشوينى پيباوه تي پيي نيشاندا وه ئه وى له هه مولا پيى به كمال ئه كا بيخاته دلى ، نوسين وه خوينـدن بودل روني وزانين وپيك هينانى پي وي ستان ورا گرتنى ايشى كرين وفروشـتن ومه له بويارى وبازى وه خو يه راندنه وه له ته نـكانه دا . وه

٢٠ عن انس بن مالك ان رسول الله (ص) قال طلب الحلال واجب على كل مسلم الديلمي

وه شوين كه وتني مالى پي ره وا له سه‌ر هه‌مو مسلمانيكه. (١)

---

هه رچي به‌هره ى هه يه پولادانى دوشمن، هه‌مويان ئه‌بي به‌منال ياد بدري

وايش وصنعى كشى فير بكري بوئه مه بيته سه‌ر مايه‌ى به‌وي چون كه پى بژي ودەست نه‌ابو مالى مه‌ردوم

٢٠ (١) انسان له‌م دنيايه دابه‌سي مال نازى وه‌مال‌يش پيك نايه به‌سي كسب وايش كه وابي پياو ئه‌بي بوروزي وه گير خستن وخوله داماوى ده رخستن ايش بكا خوه‌ه ركزنه خاته ژير بار منتي مه‌ردوم ، چاوله دەستان به دبه خي وفروته نييه . ئه‌بي به هه‌ر جور بي به ايشى كي پاك نان وه گير بخريه انسان هه‌روه ك خوي يه كيكه له كه‌ساني كومه له ئه بي كسبيشى يه كيك بي له كسباني ناو وطنى

وه هه رايش وكسبى پياوخوى پى له ته نكانه ده رخا باشه هيچ كه‌مي تيدانيه . كه‌مي له ته نبلي وبيكاري وچاوله ژيريايه

٢٦ عن انس ان رسول الله (ص) قال من بات كالا من طلب الحلال بات مغفوراً له . ابن عساكر

كەسي شەوي بەماندويي بەسەرابي لەشوين كەوتني مالي گەوارا، شەوي بە سەر'ها توەوە بەلي خوش بوراوي .(١)

٢٧ عن ثوبان ان رسول الله (ص) قال من يتكفل لي ان لا يسأل الناس شيئاً اتكفل له بالجنة . د

هەركەس لەشـــاني خوي بگري ئەمەنە خوازي چشتي لەمەردوم ، من لەشاني خوم ئەگرم بە هەشت بووي .(٢)

(١) سەرچاوەی خوشی ومەردا یەتي بو انسان لەم دنیایە دا، ریك كەوتني ئەوانە یە كەزندەگیـان پي پیك‌دي وەپیـاوي لەتنگانەي نەداري وژيرباري دەر ئەخەن ئەمەش نابي بي كوشش ودو وا كوتني ایش وكسب ، بەجوري پیاو لە زوري كردن ودزي وفیل وفریب دوربي . خواي گەورە ئەم كوششی انساني بوروزي خوي زوربي خوشە وەداي ناوەبە بەجي هیناني حقی بەندەكي وپەرستن . وەبەمە لەگوناهاني ئەبوري .

(٢) خواي گەورە هەروكو انساني بەپي ویستي مایەي ژیان

عن انس ان رسول الله (ص) قال : خيركم من لم يترك آخرته لدنياه ولا دنياه لآخرته ولم يكن كلاً على الناس . خط

باش‌ترینی ایوه كه‌سيكه روژي دوواي بەجي نه‌هيلي بو روژي پيشو (دنيا) وه‌روژ پيشوش بەجي نه‌هيلي بو روژي دوواي وه نه بيته بارله سه‌ر مه‌ردوم . (١)

---

له خوراك و پوشاك . . . دوروست كردووه بەم جوره هيز وزانين و تووانينيشی داوه‌تی كه بكوشی ئه‌وی ئه‌يه‌وي بەزوري بازو ساز وآماده‌ي بكا . خوچاو بە رەژير نەكا بە پارانه‌وه وخواستن كه‌سي وابكا خوي ئه‌شكيني نفسي خوي سوك ئه‌كا . كه‌سي بكوشی له ربی وه‌كير خستني روزي له دوستوري خواده رناچي جيي بەهەشته .

(١) خوا لەم دنيايه‌دا ، انساني دوروست كردووه بو آوه‌دان كردن وبه‌هره بردن لەزه‌وي كه ببيته جي نشين خواي ( جاعل في الارض خليفة ) بوريك خستني شوين آوه داني وآسايستي وئه‌بي له كه‌ل ئه‌مه‌ش زور به خواشناسي و پاكي بەريدا بروا ، وه‌به هه‌شتي بەما نه‌ئه‌دا . كه‌وابی كه‌سي كه‌هه‌رخه ريكي دنيابی

٧٠) عن الحسين بن علي ان رسول الله ص قال : طلب العلم فريضة على كل مسلم . خط ومسلمة .

وه شوين که وتى زانين له سه ر هه‌مو مسلمانيکه .(*)

---

خواله بيركا . وه‌يا که‌سي گوشه نوشيني بكا دور بى له مـه‌ردوم له وشـويني خوادا پنـاوه وله‌دوستوري وي‌دورن وگوناه بار پياو ئه‌بى چاوله پيغه‌مبه‌ران ويارانيان بكا كه‌چون هه‌ردو لايان گرتووه وه‌هيچ لايان به‌جي نه‌هيشتووه .

(*) انسان ، بوخوشى وآسايشي ژياني له‌روژي پيشو وپاشي ( دنيـا وقيامت ) داپي ويستي زانينـه كه به بي زانين نـه خوائه نابي ونه ئه مه ي له سه ريه‌تي بوبه رستنى به جـبي ديي وه نه ايشي‌وكار ونه به‌رابه‌ري دوشمني بي‌ئه‌كري انسان‌وه‌ك جانه‌وه‌ري تر نييـه له‌خورابه ري بچي وله خويدا سـلاحي لابردني دوشمني ببيه ئه‌مانه‌ي هيچيـان بو پيك نايه به‌بي‌زانين كه وابي مه‌ردي دانا هه‌ميشه ئه‌بي بكوشي زانيني كه به هره‌ى ببيه له‌دل زندوه كردن وبه هوش بون وه‌ئه مي مايه‌بي بوآوه داني وطن‌وبلندي كومه‌له په يداى بكا وبلاوي بكاته وه .

٢٨ عن انس ان رسول الله ص قال: احبسوا على المؤمنين ضالتهم العلم . الديلمي

راگرن بومسلمانان لی گوم بوي خويان كه زانينه (١)

٢٩ عن ابن مسعود ان رسول الله ص قال : الناس رجلان عالم ومتعلم ولاخير فيما سواهما . طب

انسان دو كه سه : دانا وئه‌م كه‌س‌وه دووزاي زانين‌ئه‌كه‌وي وه‌هيچ سودنيه له كه‌سي ترا . (٢)

---

(١) چونكي هيچ چشت بوانسان به‌بي زانين پيك‌نايه له‌هه‌مو بزوتنه وه وله ايشى هه‌ردوروژاني ( دنيا وقيامت ) پي ويستي زانينه . كه خوي باش په يدا كردن وخوا ناسين وپه رستن ، روزي په‌يدا كردن لاداني دژمن وه‌كوشش كردن له‌ري جواني وطن هه‌مويان زانينيان ئه‌وي به‌بي‌وي ريك‌نا كه‌وون له‌به رئه‌مه زانيني ناونا به لی گوم بويه‌ی مسلمان ئه‌بي ليي بگه ري هه‌رچي سودي هه‌يه بووه‌ی بيزاني وه‌گيري بخارانه وي دستي .

(٢) جوی يه‌تي انسان له‌چشتي تربه هوش‌وتي‌گه‌يشتنه وه هه تاپياوبه هوشتر بي پايه ي‌له مه ردايه تي دابلنــــد تره. وه

١٦ عن ابي هريرة ان رسول الله (ص) قال : الناس ولد آدم وآدم من تراب . ابن سعد

مەردوم هەموله آدمەمن وآدمیش لەخاکە (*)

---

جگە لە مە ژیان بە بی زانین پیك نایە، بە رزی و بلندی انسان بە زانینی پوخت وباشە کە خوشی دلگوشادی کیان وخو جوان کردن وآرایشی نفس بە زانین وهوشە وە هەرچە ندمە ردبتر لەخوی وە هەرچی لەژیرچە رخایە بگا، بلند ترو انسان ترە کەوابی انسان ئەبی خە ریکی زانین بی و بلاوی بکاتە وە کەسی ئەمە ی نە بی جانە ورە چم بە هرە ی نییە .

لە زانین نازمیرری ئەمانەمیشك ووشك ئەکەن وەکو مەتەلوکە (لغز ومعما) یاوورد بونە وە لەمە فلان زوبان ماضی ومضارع وامری بوچ واهەل کەوتووە زانینی کەلەسەرەوە کە سە زانینی خوا ناسین وپە رستنیە تی وە زانینی خوان (اخلاق) و جغرافیا وتاریخ جی یان وکە وران وژمارو کیمیاوە زانینی بەرێ چون وفە رمان بەسە ربردنە ئەمانە هەمو کەس ئەبی بەشی بەخوی بریکیان لی بزانی .

(*) ئەفەری انسان هەمووە کویەکن کەس لە کەس بتر نییە،

١٦ عن ابى هريرة ان رسـول الله (ص) قال : من لم يدع قول الزور والعمل به فليس لله حاجة في ان يدع طعامه وشرابه .خ

كەسێ کە بەجێ نەهێلێ گوتەی نارەوا وایش ناهـەموار ، خواهیچ نایەوێ نان وآو نەخوا . (*)

---

هەموئه چنه وەسەر آدم وبیچوی آدمیش نابی خو بە زۆر بگري ئەبێ خاكي بێ وخۆبە کەم بزانی چونکە آدم لە گل پەیدابووە. وە بەراستي بەرتە ري انسانان بەپاریزو خوي باش وزانینە، نەبە پشت وباوك وباپیر .

(*) بەهرە لە نویژ وروژو ، خواوە بیرخستن وخۆگیرانە وەیە لەآرە زووان کەپیاو خوتوند راگری لەبەرابە ری خواستەی نفسي بتوانی خووان خوی باش بکا شیطان هەلي نەسوریني . کەسی نویژ وروژ وئەمەندە زوری نەبی لەسەري کەپێي لەناهەموار بکە ریتەوە . چم سودی نابی لە کردنیـــــان وماندویی خورایی پێ ئەمینی .

عن ابي الدرداء ان رسول الله (ص) الا اخبركم بافضـل من درجة الصيام والصلوة والصدقة ، اصـلاح ذات البين فان فساد ذات البين هي الحالقة . ح ، د

پێو بلێم گەورەتر لە پایەی نوێژ وروژو بەخشین چی یە؟ رێك خستنی مەردومە چونکە نیوان ناخوشی بەرباد دەرە .[1]

عن ابن عبـــاس ان رسول الله (ص) قال : لاصَرُورَةَ فی الاسلام . ح

ژن نەهێنان لە اسلامانییە .[*]

---

(١) ریك کەوتنی فەرمانی کومە لەووطن بەستە یەبە یەك کەوتنی مەردوم وریك کەوتنیان وەئەگەرئەمان ریك نەبن ، هیچ خوشی وآسایش پێك نایەوە هەمو ایشیان تیك ئەچی لەبەر یەك بلاوئەبن نامینن . پــــاو ئەبی کیشە نەهێلی لەناوا تا کومەلەوێك کەوی . ریك خستنی مـەردوم لەنوێژ وروژو بەخشش چاترە کە ئەونەبی ئەمانەش نابن وەکومەلەنابود ئەبی .

(*) لەناو هێندیك لەخودانی دینی ترەوایە خو بچرانە وەلەکارو کرداری دنیاوە کەنارە گیری وخوشاردنەوە لەمەردوم وژن

عن عبد الله بن عمرو بن العاص ان رسول الله (ص) قال : ان الله يحب ان يرى اثر نعمته على عبده . ت

خوایی خوشه كه ببینی نیشانەی چاكەی خوی لەسەر عبدی[1]

نەهینان وخوشی نەبردن لەروزی پاك ، لە خواشناسی وبەجی هینانی حقی پەرستنە. وەدیارە ئەمەش دەرچونە لەوشوینە خوالەم هەستی یەدا دایناوە كە انسانی دورست كردوە بە خاوەنی تەن وگیان وە بەژن وپیاو وئەم هەستی وزەوی وئەمی تێ دایە داینادوە بووەی ئەمان پێكەوە بەهرەی لێ ببینن وپێ بەری بچن وەزەوی خوش بكەن وآوەدان وەئەگەر گوشە گیری بكەن ئەمانەنابن لەبەر ئەمە پیغەمبەر ئەمەی فەرمووە .

(١)خوا كەچاكەی كرد لەگەل كەسی بەمال وزە نگینی ئەبی وە دەری خا ، بوخوی ومنالی خوش گوزەران بن وە دەستی مەردوم بگری بە داما ووهە تیو وبی چیزان بنواری كومەك بكا بە هاوشاران وە لە ریگەی بلندی وطن دریغی نەكا كە ئەمانە سوپاسی ئەم بەخششی خوایە ، ئەگەر روانە كاپارە پەرستە وە نازانی بژی

عن خالد بن الوليد ان رسول‌الله (ص) قال : ارفع البنيان الى السماء واسئل الله السعة . طب

بلند بكه خانوو بۆ آسمان‌وه له‌خواش بخوازه گوشادي .(١)

عن ابن مسعود ان رسول الله (ص) قال : الطيرة شرك

شوم كرتن ، هاۆالي بوخوا دانانه .(٢)

---

(١) خوا كه زه‌نگيني وخوشي دابه انسان، ئه‌بي سوپاسي بكا. زه‌وي آوه‌دان بكا وخوشي لي ببيني وه‌له وريگه خواد اينـاوه گوشاديشي لي بخوازي. هه‌تازور ترى ببيه چاتره وه‌لي پاوناني دل‌وده‌روني بيه‌ستي‌به دنيا وبير وهوشي‌ته نگك كاله سه‌ري .

ئه‌بي بزاني له‌ده‌ست ئه‌چي ، چاترين چشت به رستني خوايه ودل پاك كردن وخوباش بون .

(٢) واهاتووه له‌ناو هيندك له‌نادانان كه به‌بيستني كلمه يه‌ك وه‌يابه سه‌وه‌ري وه‌چشتي‌تر له‌ايش وفه‌رمان ئه‌گه رينه‌وه نايكه‌ن. كه‌سي آره زوي جي يه‌كي‌ ببيه بچي به‌ريدا ئه‌روا بالنده هه‌له فريني كه له‌پيشه‌وه روبي بوايشه كه ئه‌روايي چا كه، كه به‌پشته‌وه داروبي ، ئه‌گه رينه‌وه ناچي پيي به‌ده . وئه‌مانـــــه

عن انس بن مالك ان رسول‌الله (ص) قال : الصبر من‌الايمان بمنزلة الرأس من الجسد . الديلمي

خورا گرتن بەچاو ایمان وەکوسە روایە بەچاوتەن (١)

---

هەموله نەزانینن کەانسان نابي باوەري بیبێـە لەدەرەوەي ئەمانە کەخوا داینا‌وون کەلە نیهاد وبو نیادی خویانا یەك تر ئەکیشن وەبي یەك پێك نایین (اسباب طبیعیه) هیچ چشني تر ایشي پي ئەکری یافەرماني ییبە وەزوري گوراندني هە یە لەم هەستي یەدا. هەرگز خواها والی نییە وەئەمانە باوەري پوچ وخورایین.

(١) خورا گرتن لەتنگانا ناوهەل گرتني دەردوکیشە وزوري ونەداري سەر چاوەي هەموخوي باشە ، کە کەسی وابو ئەتواني خولەگوناهان‌وآرە زوواني پەست بگیریتەوە لەریگەي گەورەيي هەمودە ردي سەر قوتدا ، پیاوي خوراگر آزا وبي باك وآزاد وداد خواه ئەبي ، هەروە کوسەر سەر چاوەي تي گەیشتنە ، خوراگرتنیش سەر چاوەيهەمو خوش بەختي وخوي باشە.

٣٨ عن الحسين بن علي ان رسول الله (ص) قال : من حسن اسلام المرء تركه ما لا يعنيه. ح

لەباش دینداري یە، خۆتێنەگەیاندني چشتێ کەبەکاري پیاوي نایا. (١)

٣٩ عن المطلب بن عبدالله ان رسول الله (ص) قال : الهوا والعبوا فاني اكره ان يرى في دينكم غلظة . هب

بازێ وياري بكەن. چونكە پێم ناخوشە وابزاندرێ لەناوديني ايوە توند وگیري هەیە . (٢)

---

(١) هەركاري بەهرەي بۆپیاوێ تیسانە بێ اي خۆي یا اي كۆمەلە ، نابێ وەشوێنێ بكەوێ لیێ بكولیتەوە وەكوزانین هەستان ودانشتني وەپرسیاري ایشي دەرەوە وناومال ومنالی كەسێكی تر ، پیاو خۆلەم جورە ایشانە ئەبێ دوربگري .

(٢) انسان ئەبێ لەشەو وروژیندا دەمێك خۆ آسودە بكاوە هەموبیر وبەستەگي دنیالە دلدە راوێ لەجێیەكي خوش هەواي تازە بخوا بازە وياري بكا مشت ومالي خوي بدا تاتەن وگیاني تازە ببیتەوە وهێزي تازەي بیتە بەر كەدین ئەیەوي پیاو هونەرمەند وآزا وتازەبي .

ح عن مسروق ان رسول الله (ص) قال يحق بالمرء ان يكون له مجالس يخلو فيها ويذكر ذنوبه فيستغفر الله منها . هب

شیرینه بۆ پیاو ئەمە چەند جارێك خۆتەنها بكا وگوناهانی خۆی بكاتەبیر ولەخوای بخوازی لێی خوش بونیان .[1]

---

(١) هیچ كاتێ بۆ پیاوی شیرین تر وخوشتر نییە لەودەمە كە لەدلی خۆی دەراوێ هەموچشت ولەبیر بكا خوشی یوشەرد بەدلی پاك وروناك روبكاتە بارەگای گەورەیی خوابەندەگی وداماوی خوی ببینی،وبخوازی قلمی بەخشش بەسەر گوناهانیا بی كەسی ئەم دەمەی ببیە لەشەو وروژا جاری هەمیشە دلزندو وپاریز كار وگەراوە وەئەبی لە پەستی وبەدی ، وخوشە ویستی بلندی وگە پیشتن بە انسانیتی راستی لەدلیـــا پەرە ئەگری ، هەموگیانی ئەبیتە بەهرە بوخوی ومەردوم وزیانی لە دەست وزوبانی دور ئەبی .

كوتابو